

# گریان له‌ ترسی خوا

نوسینی

**هاوكار**

١٤١٩ك چاپی دووه‌م ١٩٩٨ز



## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان درودرو رەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر.

خوێنەری خۆشەویست گریان لەترسی خوای گەورە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی کەسانی خاوەن بڕواو لەخواترس.

قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەریش لەزۆر کاتدا ئاماژەیان بۆ ئەم مەبەستە کردووە.

خوای گەورە لەئایەتی( ١٠٩ ) لەسورەتی ( الإسراء ) دا دەفەرموێت:

**﴿ ويخرون للأذقان يبكون ويزيدهم خشوعا ﴾**، واتە: (ئیمانداران سەر ئەنێنە سەر زەوی و کڕنوش بۆخوای گەورە دەبەن بەدەم گریانەوە خوای گەورەش هێندەی تر- خشوع- یان پێ دەبەخشێ ) هەروەها لەئایەتی( ٥٩ – ٦٠ ) ی سورەتی( النجم )دا

## گریان لەترسی خوا ﴿ ٢ ﴾

دەفەرمویت: ﴿ أفمن هذا الحديث تعجبون ، وتضحكون ولا تبكون ﴾، واتە: (ئەوە ئێوە سەرتان لەم قورئانە سوڕ دەمێنێ، وە ئێوە پێ دەکەنن و ناگرین؟!)،

واتە سەیرە کە لەکاتی خوێندنی قورئان و بیستنی دا موچوڕکە بە گیانتاندا نایەت و ناگرین.

بوخاری و موسلم دەگێڕنەوە لە کوڕی مەسعودەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمویت: (پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: قورئانم بەسەردا بخوێنە. منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئان بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە ئێستاکە من بەسەرتۆدا بیخوێنم! پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: من حەز دەکەم لەغەیری خۆمەوە گوێم لێی بێت، منیش سورەتی(النساء)م بەسەردا خوێندەوە تا گەیشتمە سەر ئەم ئایەتە: ﴿ فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد... ﴾ واتە: ئەبێ حاڵیان چۆن بێت ئەو ڕۆژەی هەموو گەلێک دەوەستێنن و پێغەمبەرەکەشیان بەرامبەریان دەوەستێ و شاهیدییان لەسەر

دەدات، وەتـۆش بەرامبـەر ئەمانـە دەوەسـتیو شـاهیدیان لەسـەر دەدەیت؟! ).

کوڕی مەسعود دەفەرمویت: لەو کاتەدا پیغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی: تـا ئیرە بەسـە، منیش تەماشـام کـرد بینیـم بـەچاوە پیرۆزەکـانی فرمیسک دەڕیژێت.

ئەنـەس (رەزا و رەحمـەتی خـوای لێ بـێ) دەگیڕیتـەوە دەفەرمویت: (رۆژێکیان پیغەمبـەر(ﷺ)وتـاریکی بۆدایـن، تـا ئیستە وینەی ئەو وتارەم نەبیستووە کەتیایدا فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئیوەبتان زانیبایە کەم پیدەکەنین و زۆر دەگریان).

ئا لـەو کاتـەدا هاوەڵـەکانی پیغەمبـەر(ﷺ) هـەموویان سـەریان داخست و دایانە پرمەی گریان..

## خوینەری بەڕیز:

لەڕاستیدا ئایەت و فەرموودە زۆرن کەباسی فـەزڵ و خـیری گریـان دەکەن لەترسی خوای گەورە، ئیمەش لەم پەیامـەدا بـەگویرەی توانـا چەند نمونەیەک باس دەکەین لە ژیانی هاوەڵان و شوین کـەو تـوان

بەرامبەر ئەم سیفەتە گەورەیە کە بریتی یە لەگریان لە ترسی خوای گەورە، بەڵکو خوای گەورە سوودی ئەم نامیلکەیەمان پێ بگەیەنێت و ببێتە هۆیەک بۆ گەڕانەوەو پەشیمان بونەوەمان بۆ خزمەت بەخوای گەورە و پەیامە پیرۆزەکەی.

هەریەکێک لەئێمە ئەم سیفەتەی تیابوو ئەوا بەختەوەرە، ئەگەر نا ئەوا بەدبەختە هەروەک (إبن کثیر) لە کتێبی(البداية و النهاية) قسەیەکی ئەبو سلیمان الدارانی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: هەموو شتێک نیشانەیەکی هەیە، نیشانەی بەد بەختیش ئەوەیە مرۆڤ لەترسی خوای گەورە گریانی نەبێت!).

لەکۆتایدا داواکارم لە خوای گەورە کەئەم کارەم لێ وەربگرێ و بیخاتە نامەی کردەوەکانمەوە و ببێتە توێشوویەک بۆ ڕۆژی دوایی.

و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.



## ١- ئەبو بەكری صدیق:

ئەو پیـــاوەی كـــەبڕوای تـــەواوی هـــەبوو بەفـــەرمودەكانی پێغەمبـەر(ﷺ) چ لەگەشـتەكانیدا و چ لەماڵـەوە، فـــەزڵی بـــاڵاترە لەهەموو ئەو كەسانەی خاوەن فەزڵن، هەوڵ و تێكۆشان و خەباتیشـی لە لوتكەدایە.

خوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دەربـارەی هێناوەتـە خـوارەوە: **﴿لا يستوي منكم من أنفق من قبل الفتح و قاتل﴾**، واتە: (ئەو كەسانەی كەپێش ڕزگار كردنی مەككـە، مـاڵ و سـامانیان بەخشـی و لەپێناوی خوادا دەجەنگان، پلەیان بەرزەو كەس وەكو ئەمان نی‌یە).

زەیدی كوڕی ئەرقەم دەگێڕێتەوە كـە ئەبوبەكر ڕۆژێ داوای ئاوی كرد، پەرداخێ لەهـەنگوین و ئاویـان بۆ هێنـا، كاتێ و یستی بیخوا تەوە دەستی كردە گریان، پاشان ئەوان بـێ دەنـگ بـوون بـەڵام ئـەم گریانەكـەی زیـاتر جۆشـی سـەند، پاشـان خەڵكەكـە جـاریكی تـر گریانـەوە، پاشـان بـێ دەنـگ بـوون، ئـەبو بـەكریش بـێ دەنـگ بـوو، هاوڵـەكان ووتیـان: ئـەبو بـەكر ئـەی جـێ نشـینەكەی پێغەمبـەری خوا(ﷺ)، بۆچی ئەگریت؟:



ئەویش فەرمووی: رۆژێکیان لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا(ﷺ) بـووم، کـەسمان لەگـەڵ نــەبوو، پێغەمبـەریش(ﷺ) بەدەسـتی ئیشـارەتی دەکرد و دەیفەرموو واز لەمن بێنە، واز لەمن بێنە ، منیش وتـم: ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆ کەسمان لەگەڵ نی یـە، جـەنابت لەگـەڵ کـێ قسە ئەکەی؟

فەرمووی: (ئەوە دنیـا بـوو، خـۆی گـۆڕی بـوو خـۆی رازاندبـۆوە و هاتە بەردەستم، منیش وتـم واز لـەمن بێنـە، واز لـەمن بێنـە، دنیـاش وتی: ئەگەر تۆ لەمن رزگارت بێ کەس لەمن رزگـاری نـابێ لـە دوای تۆ) ئائەوە بوو هۆی گریانەکەی من... !.

## ٢- عومەری کوڕی خطاب:

عومـەر خـاوەنی پلـە وپایـەی بــەرزە، عومــەر ئــەو پیاوەیــە لەخوای گـەورە بـەهۆی ئەرەوەبانگـەوازی پێغەمبـەری ئاشـکرا کـرد، عومەر ناز ناوی(فاروق)ی لێ نـرا واتـە: جیاکـەرەوەی حـەق و بـەتاڵ لەیەکتر.

لەژیاننامەکـەیدا هـاتووە دەڵێـت: عومـەر ئـەوەندە گریـا بـوو، دوو هێلی رەش لەسەر رووومەتی دروست بوو بوو.

لە(مستدرك الحاكم)دا هاتووە، دەڵێت: عومەر کاتێک لەحەج دا لێوی خستە سەر (الحجر الأسود) و ماچی کرد دەستی کردە گریان.

هەر لەژیاننامەکەیدا هاتووە دەڵێت: عومەر لەسەردەمی خەلافەتیدا کەبەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، لەنوێژی عیشاو بەیانیاندا عادەتی وا بوو(سورەتی یوسف)ی دەخوێند، کەدەستی دەکرد بە خوێندنی خەڵکەکە لە ریزەکاندا گوێیان لەهەنسکی گریانی بوو، زۆر جارئەم سورەتەیدەخوێندەوە لە نوێژدا.

هەروەها(عەمری کوڕی شەیبە) باسی دەکا و دەفەرموێت: شەوێکیان عومەر کەوتەڕێ بۆ سەردانی (أبو درداء) پاش ئەوەی ماوەیەک پێکەوە دانیشتن(أبو درداء) فەرموی: ئەیعومەر ئەو رۆژەت لە بیرە کە پێغەمبەر(ﷺ) قسەی بۆ دەکردین فەرمووی : *(لیکن زاد احدکم في الدنيا كزاد الراكب)* واتە: (با هەر یەکێ لە ئێوە هێندەی پیاوێکی گەڕۆک لە دونیادا خواردن و توێشووی لەماڵیا بێت).

فەرمووی : بەڵێ.

(أبو درداء) ووتی: براکەم، ئەزانی ئێمە چیمان کرد لە دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ؟!.

(عومەری کوڕی شەیبە) دەفەرموێ: دوای ئەم قسەیە هەموومان دەستمان کرد بە گریان تاکو بانگی بەیانی...

## ٢- عثمان ی کوڕی عەففان:

عثمـــــان خـــاوەنی دوو کژچـــە،( ذا النورێـــــن )ی پـــێ ووتـــراوە، پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی بەهەشتی دابە لەئەنجامی‌ئەو بەڵایەی کــە تووشی دەبێت لە داهاتوودا، کەبریتی بوو لــەوەی بەناحەق شــەهیدی دەکەن.

(حاتەمی )خزمەتکاری دەگێڕێتەوە دەڵێت:

عثمان عادەتی وابوو، هەرکاتی‌بچوایەتە سەر گۆڕێکە هێندەدەگریـا تاکو ڕیشی پیرۆزی تەڕ دەبووبە فرمیسکەکانی و دەیفەرموو: گوێم لە پێغەمبەر بووە(ﷺ) فەرمویەتی: (هیــچ دیمــەنێکە هێنــدەی گــۆڕ ترسناکە نی‌یــە ) هــەروەها گوێـم لێ بـوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (گۆڕ یەکەم قۆناغی قیامەتە، جا هەرکەس لە گۆڕدا ڕزگاری بوو، ئــەوا قۆناغەکانی تری ئاسـانە، هەرکەسیش ڕزگـاری نـەبوو لـە گـۆڕدا ئـەوا قۆناغەکانی تری سەخت تر دەبن).

## ٤- عەلی کوڕی ئەبو طالب:

ئیمامی عەلی پێشەوای خواناسانە، خاوەنی دوور بینی یەکی زۆر بووە، هەموو قسەکانی دانایی و پەند بوون، لەداد وەریدا داد پەروەر بوو، سەرچاوەی زانست و زانیاری بوو، دڵی بە خۆشی دنیا و زرق و رازانەوەی نەدەکرایەوە، بەڵکو حەزیلە تاریکایی شەو دەکرد بۆ عیبادەت، مرۆڤی دینداری خۆش دەویست و ریزی لێ دەگرت،دڵسۆزو دۆستی هەژاران بوو، کاتێ شەو دەهات و ئەستیرەپرشنگی دەدا دەچووە میحرابی نوێژ و دەستی دەکرد بەشەو نوێژ، دەستی دەگرت بە ریشیەوە و زۆر بەکوڵ دەگریا، بەیانی یەک هەستاو نوێژی کردو بەکزۆڵەیی یەوە سەری داخست و لە شوێنی خۆی نەجوولا، کاتێ کە خۆر هەڵهات دەستی گرت بە ریشی پیرۆزی یەوە و گریا،فەرمووی: من هاوەڵانی پێغەمبەرم بینیوە ،بەلام هیچ کەسیکم نەبینیوە وەکو ئەوان، کە رۆژیان لێ دەبوویەوە سەرو قژیان تیک دەچوو رەنگیان زەرد دەبوو، ناوچەوانیان خاڵی رەشی پێوەبوو لەبەر زۆری کڕنوش بردنیان لەسەر حەسیرو شتی زبر، شەویان بەوەستان و کڕنوشەوە لە

عیبادەتی خـوای گـەورەدا بەسـەر دەبـرد، بـەردەوام بـەرز دەبوونەوە و دادەنەوینەوە، کەرۆژیش دەبووەوە یادی خوایان دەکرد و دەگریان، سویندبە خوا وایان دەزانیئەو شەوە هیـچ ئاگایـەکیان لـە خزانەبووە و خەریکی تاوان بوون.

بەڵێ ئیمامی عەلی دوای ئەو رۆژە هـەرگیز نـەبینرا بـە پیکـەنین و ڕوخۆشییەوە هەتا کۆچی دوایی کرد.

٥- عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە :

ئەم پیـاوە پایـە بـەرزە لەکاتیدابـەزینی ئایەتـەکاندا زۆر بـیری دەکردەوە، هـەڵگری ئـاڵای ئیسـلام بـوو، خۆڕاگـر بوو لـە جیـهاددا، (لەشەڕی بەلقا) لەشام لەجەنگی (مۆتە)دا شەهید کرا، مرۆڤیکیدنیـا نەویسـت بـوو زۆر بەپەرۆشـییەوە حـەزی بـەدیداری خـوای گـەورە دەکرد.

لە (عروەی کوڕی زوبەیرەوە) دەگیڕنەوە: کەلەو کاتەدا(عەبدوڵای کوڕی رواحە) بەرەو خاکی مۆتـــة بـەرێ کـەوت موسـلمانان هـاتن و

خواحافیزیان لێ کرد، لەو کاتەدا ئەمیش دەستی کردە گریان،وتیان: بۆچی دەگریت؟:

وتی: سوێند بەخوا نەحەزم لەژیانی دنیایە و نە بۆ ئێوەش فرمێسک دەڕێژم، بەڵام من بیستوومە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ **وإن منكم إلآ واردها كان على ربك حتما مقضيا**﴾ مریم/٧١، واتە: (خوای گەورە بڕیاریکی حەتمی داوە کە هەریەکێ لە ئێوە پێویستە بەسەر (دۆزەخ) دا تێ‌بپەڕێ.

بیرم لەوە دەکردەوە، ئەوا من بەسەر پردی (صراط)دا تێ پەڕیم، ئایا بەسەلامەتی ڕزگارم دەبێ و دەگەمە ئەو بەر.

کاتێ کەموسڵمانان خۆیان حازر کرد بۆ دەرچوون بەرەو خاکی (مؤتە)، عروە فەرمووی:

خواحافیزتان بێ و داوا ئەکەین لە خوای گەورە بەرگریتان لێ بکە و بتان پارێزێ یەکسەر (عبد الله) ئەم شیعرەی فەرموو:

*لكني أسأل الرحمن مغفرة وضربة ذات فروع يقذف الزبدا*

*أو طعنة بيدي حران مجهزة بحربة تنفذ الحشاء و الكبدا*

*حتى يقولوا إذا مروا على جدثي يا راشد الله من غاز و قد رشدا*

واتە:

بەلام من داوای لێ خۆش بوون لە خوای گەورەدەکەم

وەلیدانێک کە جەرگم پارەپارەبکات

بۆ ئەوەیکەهەرکەسێ هاتە سەر تەرمەکەم

بڵێ خوا ژیری بە ئەم موجاهیدە ببەخشێ و بەڕاستی ژیر بوو.

## ٦- عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف؛

ئەم هاوەڵە بەڕێزە یەکێکەلەو (١٠)کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێ درا، یەکێکە لەو شەش کەسەیکە بەدەستەی راوێژ(المجلس الشوری) دانرابوون، یەکێکە لەوانەی دەست پێش خەریان کرد و یەکێکە لەو کەسانەی ئەهلی بەدرن وەهەروەها یەکێکە لەو هەشت کەسەی کەلە سەرەتاوە موسڵمان بوون.

بوخاری دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان خواردنیان هێنا بۆ (عبد الرحمن کوڕی عوف) لەرمووی:

(مصعب)ی کوڕی عومەیر کە پیاوێک بوو لەمن باشتر بوو کوژرا و هیچیان دەست نەکەوت بیکەنە کفن بۆی جگە لە کراسەکەی، ئەگەر

سـەریان پـێ دابپۆشـیایە قـاچی دەردەکـەوت، وەئەگـەر قاچیـان دابپۆشیایە سەری دەردەکەوت، پاشان ئیمـە ئابـەم شیوەیە دنیامـان بۆ تەخت بوو، ئەوەندەمان پێ دراوە لە دنیا ئەترسین ئەمە پاداشتی چاکەکانمان بێت و هـەر زوو لـەدونیادا وەری بگرینـەوە، پاشـان دەستی کردە گریان و وازی لە خواردنەکە هینا.

## ٧- سە لمانی فارسی:

ئەم پیـاوە یەکـەم کەسـە لـەناو فارسـەکاندا کەموسـڵمان بـوە، هـەڵگری ئاڵای‌ئیسـلامە و هـاوەڵیکی بـەریزی پیغەمبـەر بـووە، لەخزمەتیدا بوەو فەرمودەکانی لەبەر کردووەو گیڕاویەتیەوە.

سەلمان دەفەرمویت: پیکەنینم بەسێ‌شت دێ‌و گریانیشـم بـۆ سـێ شت دێ.

پیکـەنینم دێ بەکەسـێ کەبـەبێ ئاگـایی ئـەژی و خـوای گـەورەش یـەک چرکـە لێ‌یبـێ ئاگـا نی‌یـە.هـەروەها ئـەو کەسـەی کەهـەمو هیوایەکی تەنیا ژیانی دنیایەو مردنیش بەردەوام بەشوێنیدا دەگـەڕێ، وەئـەو کەسـەش کـەپڕ بـەدەمی پـێ دەکـەنێ، ئاگاشـی لەوەنیـە ئاخۆخوای گەورە لێی رەنجاوە یان لێی رازیە.

بەسێ شتیش گریانم دێ، دابڕان لە خۆشەویستان محمد(ﷺ) و هاوەڵانی، وەبەبینینی فریشتەی گیان کێشان(ملك الموت) وەهەروەها بەراوەستان لەخزمەتی خوای گەورە، کەنازانم ئاخۆ فەرمان دەکات بۆ بەهەشتم بەرن یان بۆ دۆزەخ.

هەروەها (إبن ماجة و الحاكم)دەگێڕنەوە لە(ئەنەسی کوڕی مالیک)ەوە، دەفەرمویت: سەلمانی فارسی جاریکیان نەخۆش کەوت سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص سەردانی کرد، پاشان کۆمەڵێکی تریش هاتن بۆ سەردانی، پاشان سەلمان دەستی کردە گریان، سەعدفەرمووی: براکەم بۆچی دەگریت؟: تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوانیت(ﷺ) تۆ فلان چاکەت نەکردووە و تۆ فیسار چاکەت نەکردووە ؟ سەلمان فەرمووی: بۆ دووشت ناگریم من نە دنیام خۆش دەوێ تا بۆی بگریم، نە رقیشم لە قیامەتە تالە ترساندا بگریم، من پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەیمانێکی لێ وەرگرتم بەلام ئێستا وادەزانم پەیمانەکەم نەبردۆتە سەر و پەیمان شکێنم کردوە سەعد فەرموی: پەیمانی چی لێ وەرگرتیت؟ سەلمان فەرمووی: پەیمانی ئەوەی لێ

رەرگرتم فەرمووی: هەرکەسێ لە ئێوە تویشووی ڕێبوا ڕێکی بەسە، بەلام من دلنیام کەپەیمانەکەم شکاندووە.

پاش ئەوەی کە حسابی میراتی‌یەکەی سەلمانیان کرد بینیان هەمووی ناگاتە چل درهەم.

## ٨- عەبدوڵلای کوڕی عومەر

ئەم پیارەپایە بەرزەبێ نیاز بوو لە پلەو پایەی دنیا، بەردەوام خەریکی عیبادەت و شەو نوێژ بوو، داوای لێخۆش بوونی لەخوای گەورە دەکرد.

نافع دەگێڕێتەوە، هەرکا تێ عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی( البقرة )ی خوێند بێ دەستی کردۆتەگریان:

**﴿ وإن تبدوا ما في أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم به الله ﴾**،

را تە: هەرشتێ‌دەربخەن یان بیشارنەوە لەدەروونی‌خۆتاندا ، خوای گەورە محاسەبەتان دەکات )دەیفەرموو: بەڕاستی ئەم سەر ژمێری‌یە سەختو نارەحەتە.

هەروەهـا پێشـەوا( البيـــــهقي و الدارمـــــي ) دەگێڕنــەوە کە(عەبدوڵلا)هەرکاتێ بیری پێغەمبەری بکردایە دەستی دەکردە گریان، وە هەرکا تێ تێبپەڕیایە بەلای ماڵەکانی پێغەمبەردا( ﷺ ) دەستی دەکردە گریان و خۆی پێڕانەدەگیرا.

هەروەها دەیفەرموو: (سوێند بە خوا بگریم و فرمێسک بەدەم و چاومدابێتە خوارەوە پێم خۆشترە لە بەخشینیهەزار دینار).

ابن حجر دەگێڕێتەوە: کەهەر کا تێ (عوبدوڵـلای کوڕی عومـەر) ئەم ئایەتــەی بخوێندایەتــەوە: ﴿**ألم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكر الله**﴾، وا تـە: (ئایا کا تـی ئەوەنـەهاتووە ئیمان داران دڵیان بەیادی خوا نەرم ببێ و پڕ ببـێ لەترسـی خـوا) یەکسـەر دەستیدەکردە گریان.

بەلام ئـەبێ بزانـین کـەگریان لەترسـی خـوا سـیفەتی بەشـێک لـە هاوەلان نەبوو بەڵکو حاڵی هەموو هاوەلان وابوو!.

(عە یاض ی کوڕی ســـاربة ) دەفـەرمویت: (ڕۆژێکیـان پێغەمبـەر ( ﷺ ) ئامۆژگارییەکی گەرمی کردین، دڵی هـەمووومان هاتەلەرزین و

## گریان لە ترسی خوا ﴿١٧﴾

چاومان فرمێسکی پیاماتە خوارەوە، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا: ئامۆژگاری‌یەکەت وەک ئامۆژگاری کەسێکە خوا حافیزی یەکجاری بکات لەدەست و هاوەلانی، توخوا وەسیەتمان بۆ بکە فەرمووی: وەسیەتتان بۆ دەکەم کەلە خوای گەورە بترسن وە ببیستن و گوێ رایەڵ بن ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشیش بکرێتە بەرپرستان، چونکە بەڕاستی هەرکەس لە ئێوە لەمەو دواجیاوازی و ناکۆکی زۆر دەبینێ، دەخیلتان بم دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی جێ نشینە راشیدەکان کەبەڕاستی ئەوانە لە سەر ڕێی راستن، توند دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی ئەوانەوەو گازی لێ بگرن وە دەخیلتان بم خۆتان لەشتی‌داهێنراو ( بدعة ) بپارێزن، چونکە هەموو بیدعەیەک گومڕایی‌یە.

■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■■

## شوێن کەوتوە بەڕێزەکان (التابعين)

### ١- شێخ حەسەنی بصري:

ئەم پیاوە ناودارە زانای دنیا نەویست، خواناسی لێهاتوو،بەردەوام هاودەمی ترس و غەم باری بوو، هاوەڵێکی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کەسم نەدیوەکەغەمباری زیاتر بێ لە شێخ حسن البصري، هەرکا تێ کە چاوم پێ بکەوتایە وام ئەزانی نارەحەتی یەکی لێ قەماوە.

شێخ حەسەن دەیفەرموو: سوێند بەخوا ئەی ئادەمیزاد ئەگەر قورئان بخوێنی و بڕوات پێ‌ی هەبێت غەمباری یەکی بەردەوام ڕووت تێ دەکات، وەترس و لەرز و گریانت زۆر دەبێ لەدنیادا.

ڕۆژێکیان شێخ حەسەن بەلای گەنجێکدا تێ پەڕی بینی پێ دەکەنێ: فەرمووی: کاکە ئایا پەڕی ویتەوە بەسەر پردی (صراط)دا؟ ووتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا لێت ڕوونە کەئەهلی بەهەشتی یان ئەهلی دۆزەخ؟

ووتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی ئیتر بۆچی پێ دەکەنیت؟

پاش ئەوە هەرگیز نەبینرا ئەو کورە پێ بکەنێ.

هەروەها لە ژیاننامەکەیدا هاتووە دەڵێت: شیخ حسن البصري، دەفەرموێت: کەسێ کەبزانێ دەگات بەمردن و راوەستانیش لەخزمەتی خوای گەورەدا قۆناغێکە و لەرێی دایە، حەق وایە زۆرغەمبار بێ.

## ٢- عومەری کوڕی عبد العزیز:

ئەم جێ نیشینە بەریزەپێشەوایەکی داد پەروەر و زانایەک و دنیانەویستێکی خواپەرست بوو، بەڕاستی سەرداری ئیمانداران بوو.

دەگێرنەوە کەلەسەردەمی منداڵیدا رۆژێکیان دەستی‌کردە گریان دایکی‌ناردی بە شوێنیدا و ووتی: رۆڵە بۆچی دەگریت؟

ووتی: بیرم لە مردن کردەوە. جا لەو رۆژەدا عومەری کوڕی عبد العزیز لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزی تەواو کردبوو، کە دایکی گوێی لەم قسەیە ئەویش بوو دەستی کردە گریان.

فاطمە خێزانی‌دەڵێت: لەوانەیە لە ناو موسڵماناندا کەسانێک هەبن کە نوێژ و رۆژویان لەعومەر زیاتر بێ بەلام لە ناو خەڵکیدا کەسم نەدیوە هێندەی عومەر لە خوای خۆی بترسێ، هەرکا تێ دەهاتەوە

بۆ مال دەچووە سەر بەر مالەکەیی و بەردەوام دەگریا و دوعای دەکرد هەتاخەوی لێ دەکەوت، پاشان هەلدەستا و دووبارە دەگریا و نوێژی دەکرد و دووعای دەکرد تابەیانی.

لە کۆتایی ژیانیدا ووتاریکیدا بەم شێوەیە: پاش ئەوەی چوە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: خەلکینە ئەوەی ئێستا لەبەردەستی ئێوەدایە تالانی و میراتی گەلە پێشووەکانە ئەوان چۆن بەجێیان هێشت ئێوەش هەروا بەجێی دێلن ئایا ئێوە بۆ سەرنج نادەن هەموو رۆژو شەوێک میوانێک بەرێ دەکەن بۆ خزمەتی خوای گەورە و لەچالێکدا بەبێ دۆشەک و بەبێ سەرین ئەسپەردەی دەکەن، هەموو سەروەت و سامانەکەی بەجێ دێلێ و لەدۆست و خۆشەویستەکانی دادەبڕێ و نیشتەجێی ناوسکی ئەو خاکە دەبێ و ڕوو بە ڕووی لێ پرسینەوە دەبێتەوە، لەکردەوەدا کەپێویستی پێیەتی هەژارەو لەو میرانەیکە جێی دێلێ و ئیشی پێی نیە دەولەمەندە، ئەنجا سوێند بە خوا من ئەوەتان پێ دەلێم وەئەوەندەی دەربارەی دەروونی خۆم دەیزانم دەربارەی کەس نایزانم، دەلێت: پاشان سرچێکی کراسەکەی دا بەسەر چاوەکانیدا و

دەستی کردە گریان، ئیتر دوای ئەو رۆژە نەهاتە دەرەوە لەمال تاکۆچی دوایی کرد، پاشان جەنازەکەیان برد بەرەو گۆڕستان.

عبد السلام دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: عومەری کوڕی عبد العزیز گریا پاشان فاطمەش گریا پاشان ماڵەکەشیان دەستیان کردە گریان، کەسیشیان نەیان دەزانی بۆچی دەگرین، پاشان کە هاتنەوە سەر خۆیان، فاطمە وتی: باوکم بە قوربانت بێ ئەی گەورەی موسڵمانان ئەوە بۆچی گریایت؟ ئەویش فەرمووی: ئەی فاطمە بیرم لە خەڵکی دەکردەوە لەرۆژی قیامەتداکە خوای گەورە لێیان دەپرسێتەوە و پاشان بڵاوەی لێ دەکەن، کۆمەڵێ بەرەو بەهەشت و کۆمەڵێ بەرەو دۆزەخ دەبرێن.



## ٢- عوتبەی کوڕی غولام؛

ئەم پیاوە زۆر دنیا نەویست و لەخۆ ترس و کزۆڵ بوو، لەمات و غەمباریدا وەک شێخ حەسەنی بصری وا بوو.

شەوێکیان لەماڵی هاوڕێیەکیدا مابەوە، دەمەو بەیان بێدار بوەوە زۆر گریا پاشان کە ڕۆژ بوەوە هاوڕێکەی پێی ووت ئەری ئەمشەو بەیەکجاری مدت دڵتەنگ کرد ئەوە بۆچی دەگریایت؟

ووتی: سوێند بە خوا بیرم لەو ڕۆژە دەکردەوە کەدەچینە خزمەتی خوای گەورە، پاشان لار بوەوە خەریک بوو بکەوێت، هاوڕێکەی دەڵێت بارەشم پیا کرد، ئەبینم چاوی سوور بووە و فرمێسک ئەرێژێ، بانگم لێ کرد، عوتبە، عوتبە، ئەویش بەدەنگێکی نزم وەڵامی دامەوە و ووتی: ترسان لە ڕۆژی لێ پرسینەوە لەبەردەمی خوای گەورەدا ژوانی خۆشەویستانی لە بیر بردوومەتەوە، پاشان دەڵێ: بەگریانێکی زۆرەوە دەیفەرموو: گەورەم ئایا دەگونجێ تۆ کە زیندوو بەخشندەیت سزای خۆشەویستەکانت بدەیت.

وتی: هەر بەردەوام ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە تالە ئەنجامدا منیشی کردە گریان.

هەروەها لە ژیاننامەکەیدا هاتووە دەڵێت: لەکۆڕی مامۆستاکەیدا (عبد الواحد بن زید) ماوەی ٩ ساڵ گریاوە، هەر کە عبد الواحد دەستی دەکرد بە ئامۆژگاری، عوتبە دەستی دەکرد بە گریان هەتا مامۆستا کۆتایی بە قسەکانی دەهێنا.

وتیان بە مامۆستای بەڕێز عبد الواحد بن زید خۆزگە نەت هێشتایە بگری چونکە دەرسەکە لە ئێمە تێک دەدا، پێی بڵێ با نەگری.

ئەویش فەرمووی: سبحان الله! ئەو لەترسی‌خوا دەگری و منیش ڕێی لێ بگرم، بەڕاستی من مامۆستایەکی خراپم ئەگەر شتی وا بکەم.



## گریان لەترسی خوا ﴿٢٦﴾

هەرکەس لەترسی ئاگری دۆزەخ بگری، ئەیپارێزێ و پەنای ئەدات، براکانم ئایا لەترسی تینویەتی رۆژی قیامەت ناگرین؟ براکانم ئایا ناگرین؟! بەڵێ وەڵا بگرین، بگرین لەو کاتەدا کە ئاوی سارد دەخۆنەوە لەدونیا، بەڵکو لەگەڵ دۆستە پێشینەکانمان و هاوەڵانمان لە پێغەمبەران و راست گۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان، خوای گەورە لەئاوی کەوسەرمان پێ ببەخشێ کەبەراستی ئەوانە چاکترین

هاوەڵ و دۆستن، پاشان دەستی کردە گریان، رەحمەتی خوای لێ بێت.



## ٦- محمد کوڕی المنکدر:

مامۆستای قورئان خوێنەکان بوو، هەرکاتێ فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا( ﷺ )ی بخوێندایەتەوە خۆی پێ نەدەگیرا.

هەرکات پرسیاریشیان لێ بکردایە دەربارەی فەرمودەیەک دەستی دەکردە گریان.

لەژیاننامەکەیدا هاتووە دەفەرمویت: شەویکیان شەونوێژی دەکرد، دەستی کرد بەگریان، زۆر گریا، کەس و کارەکەی داچڵەکین پرسیاریان لێ کرد:چیتە؟ ئەویش بەدەم گریانەوە بەردەوام بوو، پاشان چوون بە شوێن(أبو حازم)ی هاوەڵی ئەویش هاتە خزمەتی و فەرمووی: ئەرێ براکەم بۆچی دەگریت؟

محمدیش فەرمووی: بەراستی ئایەتێکم خوێندەوە بۆیە دڵم پڕ بوو لە گریان.

فەرمووی: چ ئایەتێکە؟ فەرمووی: **﴿وبدا لهم من الله مالم يكونوا يحتسبون﴾**، واتە: (خوای گەورە ئەو کردەوانەی خۆیانی

پێشان دانەوە لە قیامەتدا، ئەوکردەوانەی کەبەهیچ جۆرێ گومانیان بۆی نەئەچوو).

لێرەدا (أبو حازم) یش دەستی کردە گریان و هەردووکیان تیر گریان.

ئەم پیاو چاکە تا گەیشتە سەرەمەرگ هەر ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە و دەگریا: ﴿وبدا لهم من الله مالم يكونوا يحتسبون﴾.

لەکۆتایی ئەم نامیلکەیەدا پێم باشە کەچەند ووتەیەکی (شـيخ الإسلام إبن الجوزي) - رەحمەتی خوای لێ بێ- بهێنمەوە بۆ برایانی ئازیزم دەربارەی (گریان لە ترسی خوای گەورە)کە باسی چەند مامۆستایەکی خۆیمان بۆ دەکات کە خۆی بینیویەتی و چەندە کاریگەری هەبووە لەسەریان زیادلە کاریگەری زانستە ووتەییەکان(نظـري) کە قوتابی لەمامۆستاوە وەری دەگرێت. دەفەرموێت: (گەیشتم بەخزمەتی (عبد الوهاب بن مبارك الإنمـاطي)، کە بەراستی لەسەر ریبازی پێشینانمان بوو، کەس گوێی لێ نەبووە لەمەجلیسیکدا رۆژێ لە رۆژان غەیبەت بکات، وەهەر گیز کرێی

وەرنەدەگرت لەسەر ووتنەوەی وانەی ( حدیث )، وەمن هەر کا تێ فەرمودەیەکی رۆحی( الرقائق )م لە خزمەتیا بخویندایەتەوە ماوەیەکی زۆر دەگریا.

وەمن لە وکاتەدا منداڵ بووم بۆیە ئەو گریانە زۆرکاری دەکرد لە دڵ و دەروونم و بنچینەی ئەدەب و رەوشت بەرزی لەدڵ و دەرونمدابنیات دەنا، بەراستی مامۆستا( عبد الوهاب ) نموونەی مامۆستای پیشینەکان بوو کەژیاننامەکانیان دەخوینیتەوە لەسەر ئاستی خۆ پاراستن و دنیا نەویستی و لە خواترسان.

پاشان گەیشتم بەخزمەتی مامۆستا( أبو منصور الجرهفي )، بەراستی پیاویکی بێ دەنگ بوو، زۆر وورد ەکار بوو لە قسەکردندا، خۆی ئەپاراست لەقسەی بەتاڵ، دڵسۆز بوو لەکارەکانیدا، لە هەر قسەیەک دڵنیا نە بوایە نەیدەکرد.

من سوودم لەم دو پیاوە وەرگرت، زیاد لەمامۆستاکانی تر، ئالیرەدا تێ گەیشتم کە (بەڵگەی کردا رکاریگەر ترە لەبەڵگەی گوفتار ).

## گریان لەترسی خوا ﴿٣٠﴾

رەحمەتی خوالەو زانایانەمان بێ کەدەفەرموون: (لەگەڵ کەسێکا بگەڕێ کە کردەوەکانی پەروەردەت دەکاو پێت دەگەیەنێ، قسەکانیشی خوات پێ دەناسێنێ، ئەو زانایەش خێری تیا نیە کەبەقسە باسی خوا بۆ خەڵکی دەکات بەڵام کردەوەکانی خەڵکی لە خوا دوور دەخاتەوە )...

*والحمد لله أولا وآخراً*

*والسلام على من إتبع الهدى*

ئێوارەی ژین بەسەرداهات

ناچاری بازارِ هەڵگری

بەرەو ماڵی گۆڕی تارت

بەتەنها ملی ڕێ بگری

گوناهت کرد تامی ڕۆیی

سزاکەی واچاوەڕێتە

دە فرمێسکی پەشیمانی

هەڵوەرێنە هەتا دەمری

---

نرخی (      ) دینارە